# ناسینی موشەبیهەکان

## لەڕێگەی وتەکانی سەلەف ـەوە

وەرکێڕانی :

**الشاب السني**

١٤٤٥ هـ

# پێڕست

# پێشەکی

قورئان و فەرموودەی رسول الله ﷺ سەرچاوەی هیدایەت و ڕێنمونی و ناسینی پەروەردگار و بەتاک پەرستنی و هەموو خێرێکی دیکەن .

وە موسوڵمانان قورئان و فەرموودەیان کردووە بە سەرچاوە و بناغە بۆ هەموو شتێک، بەتایبەتی لە بابەتی ناسینی الله عز وجل و چۆنیەتی پەرستنی .

وەک لەلای هەموو کەسێک کە تۆسقاڵێک ژیری هەبێت ئاشکرایە الله عز وجل لە هەموو کەسێک زیاتر خۆی ئەناسێت و ئەزانێت چ سیفەتێکی هەیە و چ سیفەتێکی نییە، هەر بۆیە الله تعالی لە قورئاندا کە کەلامی خۆیەتی وە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ وەسفی خۆی کردووە بە چەندین وەسف، وە ئێمەش کاتێک بمانەوێت الله تعالی بناسین ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ کەلامەکەی خۆی و فەرموودەی رسول الله ﷺ چونکە ئەوە تاکە ڕێگایە بۆ ناسینی .

وە لەم ئوممەتەدا پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەموو کەسێک باشتر الله تعالی ئەناسێت، وە لە هەموو کەسێک چاکتر پەرستوویەتی، هەربۆیە لە فەرموودەکانیدا بەو شتانە وەسفی ئەکات کە شایەنی ذاتی الله تعالی یە .

کاتێک رسول اللە ﷺ قورئانی گەیاندووە بە هاوەڵان رضي اللە عنهم، وە فەرموودەی بۆ گێڕاونەتەوە، هاوەڵان رضي اللە عنهم لە قورئان و فەرموودە تێگەیشتوون، لەبەر ئەوەی قورئان بە زمانی خۆیانە و بە شێوەیەکی زۆر ئاسان و سادە باسی سیفەتەکانی اللە تعالی ی تێداکراوە تا هەموو کەس لێی تێبگەن .

وە هاوەڵان رضي اللە عنهم کاتێک لە ئایەتێک یان فەرموودەیەک تێنەگەیشتبێتن ئەوە ڕاستەوخۆ پرسیاریان لە رسول اللە ﷺ کردووە، هەربۆیە بەباشی لە قورئان و فەرموودە تێگەیشتوون .

لەپاش رسول اللە ﷺ هاوەڵان رضي اللە عنهم، وە لە پاش ئەوانیش تابیعیەکان و تابیعی تابیعیەکان بە باشترین شێوە اللە تعالی یان پەرستووە و لە هەموو کەسانی پاش خۆیان باشتر ناسیویانە .

وە یەک لەدوای یەک فەرموودەکانیان گێڕاوەتەوە و بەڕاستیان خستووەتەوە .

هەربۆیە هەمیشە ئەبێت بەخۆت بڵێیت : ئایا هاوەڵان رضي اللە عنهم، وە تابیعین و سەلەف بە گشتی کاتێک قورئانیان خوێندووەتەوە لێی تێگەیشتوون؟

ئەگەر بڵێیت لێی تێنەگەیشتوون ئەوە تۆش خۆت هیلاک مەکە و مەیخوێنەرەوە، ئەگەر ئەوان بەو نزیکیەیان لە رسول اللە ﷺ و زمانە عەرەبیەکەیان تێنەگەیشتبن ئەوە تۆ هەر تێناگەیت .

وە ئەگەر بڵێیت تێگەیشتوون، ئەوە ڕاستت وتووە، جا لەبەر ئەوە ئەبێت تۆش شوێن تێگەیشتنی ئەوان بکەویت چونکە رسول الله ﷺ خۆی شایەتی بۆ داون بە باشیەتی و پێگەی بەرز بەسەر ئەوانەی پاش خۆیان .

سەلەف رحمهم الله کاتێک فەرموودەکانی سیفاتیان گێڕاوەتەوە بەباشی لێی تێگەیشتوون، وە مانای ڕووکەش و حەقیقی سیفەتەکەیان بۆ الله تعالی جێگیر کردووە بەبێ ئەوەی بزانن سیفەتەکەی الله چۆنە، وە بەبێ ئەوەی بیچوێنن بە سیفەتی دروستکراوەکانی، وە بەبێ ئەوەی تەحریفی واتای سیفەتەکە بکەن و واتای بگۆڕن و ئیمان بەو واتایە بهێنن کە خۆیان بۆ سیفەتەکەیان کردووە و کافر بن بە مانای حەقیق و ڕووکەشی سیفەتەکە وەک چۆن جەهمیەکان لە هەموو سەردەمەکاندا کردوویانە .

سەلەف هەرگیز باسی چۆنیەتی سیفەتەکانی الله عز وجل یان نەکردووە، چونکە تۆ نازانیت سیفەتی زۆرێک لە دروستکراوەکانی چۆنە چجای ئەوە بزانیت سیفەتەکانی الله عز وجل چۆنە!

بۆ نمونە کەس نازانێت لە حەقیقەتدا بەهەشت چۆنە، جەهەننەم چۆنە، مەلائیکەکان چۆنن، جنۆکەکان چۆنن، وە هیچ کەسێکمان ناتوانین وێنایان بکەین و بهێنینە بەرچاوی خۆمان .

هەر لەبەر ئەو هۆکارەیە کە سەلەف رحمهم الله بە هیچ جۆرێک بیریان لە چۆنیەتی سیفەتی الله تعالی نەکردووە و بە تەواوی خۆیان تەسلیمی قورئان و

فەرموودە کردووە و سیفەتەکانی ناویانیان جێگیرکردووە لەسەر مانا ڕووکەش و حەقیقیەکەی .

بەڵام لە سەردەمی ئەتباعی تابیعیەکانەوە کۆمەڵێک کە بناغەی عەقیدەی کوفری خۆیان لەسەر کەلام و فەلسەفە دارِشت هاتن مانای ڕووکەش و حەقیقی قورئان و فەرموودەکانیان بە کوفر و تەشبیه زانی .

هاتن کوفری کەلام یان پێشخست بەسەر قورئان و فەرموودەدا، وە هەرکاتێک قورئان و فەرموودە پێچەوانەی کوفری کەلام بووایە مانای قورئان و فەرموودەیان ئەگۆڕی بۆ ئەوەی لەگەڵ کوفری کەلامدا بگونجێت .

هەربۆیە ئەوانە کافرن بە الله و رسول الله ﷺ، لە بەرامبەردا ئیماندارن بە کوفری کەلام .

وە دەستیان کرد بە تانەدان بە ئەهلی فەرموودە و سەلەف بەوەی کە الله یان شوبهاندووە بە دروستکراوەکانی، وە پێیان ئەوتن موشەبیهە .

لەکاتێکدا سەلەف رحمهم الله هیچیان نەکردووە جگە باوەڕ بوون بە قورئان و فەرموودە بەو شێوەیەی پێش خۆیان باوەڕیان پێ هێناوە .

وە سەلەف رحمهم الله بە توندترین شێواز دژیان وەستانەوە و تەکفیریان کردن و مامەڵەی مورتەدیان لەگەڵ کردن ولله حمد .

پاشان کوللابیەکان و ئەشعەریەکان و ماتوریدیەکان لعنهم الله لعنة واسعة هاتن شوێنپێی ئیمامە کافرەکانیان لە جەهمی و موعتەزیلەکانیان هەڵگرت، وە شتانێکیان وت و کرد کە ئیمامە کافرەکانی پێشوویان نەیانئەتوانی بە ئاشکرا بیلێن .

وە بە هەمان شێوەی ئیمامە جەهمیەکانیان کوفری کەلامیان کرد بە پێشەنگی خۆیان و لە چەندین شوێندا بەسەر قورئان و فەرموودەدا پێشی ئەخەن .

ئەم جەهمیە کافرانەش شوێنپێی ئیمامە زەندیقەکانیان هەڵگرت و بە ئەهلی ئەثەر و سوننەتیان وت موشەبیهە و موجەسیمە!

لەکاتێکدا عەقیدەی ئەهلی سوننە عەقیدەی رسول الله ﷺ و هاوەڵان رضي الله عنهم و پاش ئەوانە، وە زۆرن لە ئەم سەردەمەشدا کە هەمیشە بەو ناو و ناتۆرانە تانە ئەدەن لە ئەهلی سوننەت و دەستگرتوو بە قورئان و فەرموودەی رسول الله ﷺ .

ئەم جەهمیە زەندیقانەش لە سەردەمی خۆیان لەلایەن زانایانی ئەهلی سوننەوە تەکفیر کراون، وە مامەڵەی مورتەدیان لەگەڵدا کراوە ولله حمد .

بەڵام لەلای هەندێک گومڕای گومڕاکەر کە بەدرۆ و بوهتان خۆیان ئەدەنە پاڵ سەلەف لەو بابەتەدا بە ئیمام و ئەهلی سوننە ئەزانرێن .

ئێمە دێین لەم بەشەدا إن شاء الله ڕوونی ئەکەینەوە کە تێگەیشتنی سەلەف رحمهم الله بۆ تشبیه و موشەبیهە چییە؟ چونکە جەهمیەکان باوەڕ بوون بە قورئان و فەرموودە و بەڕاستخستنەوەیان کە تەشبیه و کوفر ئەزانن .

ئەمەش ناوی بەشێک لە ئەشعەریە جەهمیە پەکخەرە زەندیقەکانە لعنهم الله لعنة واسعة کە ئەهلی سوننە تۆمەتبار ئەکەن بەوەی موشەبیهە و موجەسیمە بن :

- أبو الحسن الأشعري .

- الخطابي .

- الباقلاني .

- إبن فورک .

- الماوردي .

- البيهقي .

- الجويني .

- الغزالي .

- إبن صلاح .

- القاضي عياض .

- إبن عساكر .

- إبن الجوزي (ئەشعەری نییە بەڵام جەهمیە) .

- إبن حزم (ئەشعەری نییە بەڵام جەهمیە) .

- القرطبي .

- عز بن عبدالسلام .

- الرازي .

- النووي .

- الشاطبي .

- السبكي .

- إبن حجر العسقلاني .

- القسطلاني .

- إبن حجر الهيتمي .

- السيوطي .

وە زۆرێکی تر لعنهم الله لعنة واسعة، الله تعالی ئاگری دۆزەخیان پێ بگەشێنێتەوە .

## یەكەمین كەسانێك كە وتەی موشەبیهەیان دەرخست :

تەشبیهی پەروەردگار بە درووستكراوەكانی لەلای ڕافیضە دەركەوت، وەك چۆن الجاحظ لعنه الله لعنة واسعة دەربارەیان ئەڵێت : هیچ ڕافیضیەك نیە ئیللا بانگەشەی ئەوە ئەكات كە پەروەردگاری نمونەیەتی، هەرچەندە الجاحظ خۆی موعتەزیلەیەكی جەهمی یەكخەری كافرە بەڵام ئەم قسانەی دەرحەق بە ڕافیضە حەقە.

وە سەبەئیەكان كە شوێن عبدالله بن سبأی یەهودی كەوتن لعنه الله لعنة واسعة وە ئەم كۆمەڵەیە علي یان رضي الله عنه شوبهاند بە الله، وە هیشامیەكان كە شوێن هشام بن الحكم ی ڕافیضی كەوتن لعنه الله لعنة واسعة بانگەشەی ئەوەیان ئەكرد پەروەردگاریان جسمە وە كۆتایەكی هەیە و درێژیەكەی هێندەی پانیەكەیەتی، وە هیشامیەكانی شوێنكەوتەی هشام بن سلم الجواليقي لعنه الله لعنة واسعة كە بانگەشەی ئەوەیان ئەكرد پەروەردگاریان لەسەر شێوەی ئینسانە وە نكۆڵیان ئەكرد لەوەی گۆشت و خوێن بێت وە ئەیانوت ئەو نورێكە ئەدرەوشێتەوە، وە بەیانیەكان شوێنكەوتەی بیان بن سمعان لعنه الله لعنة واسعة كە ئەیانوت پەروەردگار نورە وە لەسەر شێوەی ئینسانە وە ئەندامی هەیە وەك ئەندامەكانی ئینسان وە هەموو ئەندامەكانی تیا ئەچن جگە دەموچاوی، وە موغەیریەكان شوێنكەوتەی مغيرة بن سعيد العجلي لعنه الله لعنة واسعة كە ئەیانوت پەروەردگار ئەندامی هەیە وە ئەندامەكانی لەسەر

شێوەی پیتەکانە، وە زۆرێکی تریش لە تاقمەکانی تریان کە کوفر و زەندەقەیان سنوری تێپەڕاندووە.

## مانای تەشبیه لای ئەهلی سوننە و جەماعە :

١ - حنبل ئەڵێ :

پرسیارم کرد لە أحمد دەربارەی وتەی موشەبیهە ئایا چی ئەڵێن؟

وتی : (هەرکەس بڵێت چاوی وەک چاوم وایە، وە دەستی وەک دەستم وایە، ئەوە الله ی شوبهاندووە بە درووستکراوەکانیەوە) .

(درء التعارض ٣٢/٢)

٢ - إسحاق بن راهوية ئەڵێ:

(تەشبیه بەوە ڕوودەدات کاتێک بوترێت دەستی وەک دەستم وایە یان بیستنی وەک بیستنم وایە، کاتێک وای وت ئەوە تەشبیهە.

**ئەمما ئەوە بوترێت وەک الله تعالی فەرموویەتی، دەست و بیستن و بینین، وە نەڵێت چۆن چۆنیە، وە نەڵێت بەوێنەی بیستنی من، ئەوە نابێتە تەشبیه،** وەک چۆن الله فەرموویەتی: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ (الشورى : ١١) .

(سنن الترمذي ٥١/٣)

٣ - بە **إبراهيم بن أحمد بن شاقلا** وترا ئێوە موشەبیهەن .

وتی : حاشا لله، **موشەبیهە ئەڵێن ڕووی وەک ڕووی من و ایە، وە دەستی وەک دەستی من و ایە.**

**بەڵام ئێمە ئەڵێین: ڕووی هەیە وەک چۆن خۆی بۆ خۆی جێگیرکردووە، وە دەستی هەیە وەک چۆن خۆی بۆ خۆی جێگیرکردووە :** ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ **(الشورى : ١١)**، وە هەرکەس وا بڵێت ئەوە سەلامەت بووە.

**(طبقات الحنابلة : ٣/٢٣٩)**

---

**: و اتای قسەکەی إبن شاقلا رحمه الله ئەوەیە ئێمە الله تعالى وە رسول الله ﷺ بەڕاست ئەخەینەوە لەوەی کە فەرموویانە، وە ئەشعەریە جەهمیەکان ئەوە بە کوفر و زەندەقە ئەزانن!**

٤ - **ابن البناء الحنبلي** ئەڵێ:

موشەبیهە و موجەسیمە ئەوانەن کە صیفەتەکانی الله دائەنێن وەک صیفەتی درووستکراوەکان، وە ئەوانە کافرن .

**(المختار في أصول السنة : ٨١)**

## مانای تەشبیه لای جەهمی و ئەشعەریەکان :

١ - الإمام أحمد بن حنبل ئەڵێ:

وە بانگەشەی ئەوەی کرد - جهم بن صفوان - کە **هەرکەس وەصفی الله بکات بە شتێک لەوەی کە خۆی وەصفی پێکردووە لە کیتابەکەی، یان رسول ەکەی گێڕاویەتیەوە، ئەوە کافرە، وە موشەبیهەیە**، بەم قسەیەی زۆرێک لە خەڵکی گومڕا کرد.

**(الرد على الجهمية : ١٠٤)**

---

**: کەواتە جەهمیەکان قورئان و سوننەت بە کوفر و تەشبیه ئەزانن و بە مایەی هیدایەتی نازانن، وە لە بەرامبەردا کوفری کەلام بە سەرچاوەی هیدایەت و ناسینی الله تعالى ئەزانن .**

بزانە ڕەحمەتی الله ت لێ بێ، ئەهلی سوننە وەک چۆن ئاگاداریان داوە لە تەئویلکەر و پەکخەرەکانی صیفەتەکان ئاواش ئاگاداریان داوە لە موشەبیهە و موجەسیمەکان، وە حاڵی ئەوان و پیسی وتەکانیان بۆ خەڵک ڕوونکردووەتەوە، وە زەمی سەلەف بۆ تەشبیهـ و تەجسیم زۆرە وەک لە عبدالرحمن بن مهدي و یزید بن هارون و أحمد و إسحاق و نعیم بن حماد و جگە ئەوانیش ئەگێڕدرێتەوە کە مەبەستیان لەو کەسانەیە کە زیادەڕۆیان کرد لە جێگیرکردنی صیفەتەکان تا وای لێهات صیفەتەکانی الله یان چواند بە صیفەتی درووستکراوەکانی .

**ئەو دەقانەی هاتوون بۆ جێگیرکردنی بوونی صیفەتەکانە نەک دیاریکردنی چۆنێتیەکەیان،** تەکلیف کردن لە عەقڵ بۆ تێڕامان لە چۆنێتیەکەی بیدعەیەکی محرمە لە دیندا، الله تەکلیفی ئەوەی لە خەڵک نەکردووە بۆ ئەوەی بەرەو تەشبیهـ و تەجسیم نەچن، وە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە تێڕامان لە الله تعالی، فەرموویەتی: (تێڕابمێنن لە درووستکراوەکانی الله، تێڕامەمێنن لە الله)، وە نەبوونی عیلم بە چۆنێتیەکانیان هیچ درزێک ناخاتە ئیمان بە صیفەتەکان و زانینی ماناکانیان .

## وتەی سەلەف دەربارەی نەهی کردن لە تەشبیه و تەمثیل :

١ - لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما ئەفەرموێ:

(هیچ نمونەیەک بۆ الله نیە) .

(النقض الدارمي : ٣١٢)

٢ - ابن عباس دەربارەی فەرمایشتی: | هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا | (مريم : ٦٥) ئەفەرموێ:

(ئایا هیچ نمونەیەک یان هاوشێوەیەک شک ئەبەیت بۆ پەروەردگار؟ ) .

(تفسير الطبري : ١٦/١٠٦)

٣ - لە الحسن البصري ـەوە (١١٠ ھ) کە پرسیاری لێکراوە ئایا وەصفی پەروەردگارت ئەکەیت؟

وتی: (**بەڵێ، وەصفی ئەکەم بەبێ نمونە بۆدانان**) .

(السنة لعبدالله : ٤٩٩)

---

: واتە بەڵێ الله تعالى وەسف ئەکەم بەوەی کە لە قورئان وفەرمووده وئاثاردا هاتووە، وە ناڵێم فلانە سیفەتی الله تعالى وەکو فلانە سیفەتی دروستکراوەکانیەتی .

٤ - الفضیل بن عیاض (١٨٧ هـ) ئەڵێ:

**بۆ ئێمە نیە خۆمان سەرقاڵ بکەین بەوەی الله چۆنە و چۆن نیە،** لەبەرئەوەی الله وەصفی خۆی کردووە و گەیاندوویەتی، ئەفەرمووێت : | قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ (١) ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ (٤) | **(الإخلاص : ١ - ٤)** .

**هیچ صیفەتێک لەوە ڕوونتر نیە کە الله وەصفی خۆی پێکردووە، وەکو دابەزین، وە پێکەنین .**

**(السنة للخلال)**

٥ - عبدالرحمن بن القاسم (١٩١ هـ) ئەڵێ:

(بۆ هیچ کەسێک نیە کە وەصفی الله بکات جگە لەوەی خۆی وەصفی خۆی پێکردووە لە قورئاندا، **وە دەستی لە هیچ شتێک ناچێت، وە ڕووی لە هیچ شتێک ناچێت، بەڵکو ئەوترێت دوو دەستی هەیە وەک چۆن خۆی وەصفی کردووە لە قورئاندا، وە ڕووی هەیە وەک چۆن خۆی وەصفی کردووە، لەویا ئەوەستین کە وەصفی خۆی پێکردووە لە کیتابەکەی، لەبەرئەوەی الله نمونەی نیە، وە هاوشێوەی نیە**، بەڵکو ئەو الله یە کە هیچ خوایەک نیە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لەو وەک چۆن خۆی وەصفی کردووە، وە دەستەکانی بڵاون وەک چۆن وەصفی کردووە) .

(أصول السنة لابن أبي زمنين : ٢٥)

: بەڵام بە پێچەوانەوە ئەشعەریە جەهمیە پەکخەرە زەندیقە کافرەکان ئایەتەکانی سیفات لە قورئان وە فەرموودەکانی سیفات بە کوفر و تەشبیهـ و تەجسیم ئەزانن، لەبەرامبەردا دێن بە کوفری کەلام وەسفی الله تعالی ئەکەن، هەربۆیە تووشی چەندین کوفر و پەکخستن بوون .

## ٦ - وكيع بن الجراح (١٩٧ هـ)ئەڵێ:

(داود الجواربي وەصفی پەروەردگاری کرد، کافر بوو بە وەصف کردنەکەی، المريسي ڕەددی دایەوە، المريسي کافر بوو بە ڕەددانەوەکەی لەسەری، کاتێک وتی: ئەو لە هەموو شوێنێکە) .

(شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي : ٩٣٥)

## ٧ - علي بن عاصم (٢٠١ هـ) ئەڵێ:

(داود الجواربي قسەی کرد لە تەشبیهدا، فەقیهەکانی واسط کۆبوونەوە لەوانە: محمد بن يزيد و خالد الطّحان و هشيم و جگە ئەوانیش، چوونە لای ئەمیر، وە هەواڵیان پێدا بە وتەکانی، هەموویان کۆکبوون لەسەر خوێن ڕشتنی، مرد لەو ڕۆژانە، هیچ کەسێک لە زانایانی واسط نوێژی لەسەر نەکرد).

(شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي : ٩٣٣)

: داود الجواربي زەندیق بەجۆرێک ڕۆچوو بوو لە تەشبیهدا کە ئەیوت الله لە هەموو شتێکدا لە پیاوێکی کامڵ ئەچێت تەنها ئەوەیە الله ڕیش و داوێنی نیە .

وە لێرەوە تێئەگەین کە هەر لە سەردەمی سەلەفدا رحمهم الله وەک چۆن جەهمیە پەکخەرەکان هەبوون بە هەمان شێوە موشەبیهە کافرەکانیش هەبوون، هەربۆیە ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ لای سەلەف بزانین چۆن و بە چ شتێک وەسفی جەهمی و موشبیهەکان کردووە.

## ٨ - الشافعي (٢٠٤ هـ) ئەڵێ:

(وە ئەم صیفەتانە جێگیر ئەکەین، وە تەشبیهی لێ نەفی ئەکەین وەک چۆن الله نەفی تەشبیهی لە نەفسی خۆی کردووە فەرموویەتی: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ (الشورى : ١١) .

**(اعتقاد الإمام الشافعي للهكّاري)**

## ٩ - أبو داود الطيالسي (٢٠٤ هـ) ئەڵێ:

(سفيان الثوري و شعبة و حماد بن زيد و حماد بن سلمة و أبو عوانة تەشبیهیان نەئەکرد، وە نموونەیان دانەئەنا لە فەرموودەکاندا، وە نەیان ئەوت چۆن؟ کاتێکیش پرسیاریان لێبکرایە بە ئەثەر وەڵامیان ئەدایەوە) .

**(الأسماء والصفات : ٩٠١)**

١٠ - نعيم بن حماد (٢٢٨ هـ) ئەڵێ:

**هەرکەس الله بچوێنێت بە شتێک لە درووستکراوەکانی کوفری کردووە، وە هەرکەس نکۆڵی لەوە بکات کە الله وەصفی خۆی پێکردووە کوفری کردووە، ئەوەی الله وەصفی خۆی پێ کردووە وە رسول ـەکەی تەشبیه نیە .**

**(شرح أصول اعقتاد أهل السنة لـ اللالكائي : ٩٣٦)**

١١ - شاذ بن يحيى الواسطي ئەڵێ:

لای یزید بن هارون (٢٠٦ هـ )دانیشتبووم، پیاوێک هات وتی: ئەی أبا خالد چی ئەڵێیت دەربارەی جەهمیەکان؟

وتی: تەوبەیان پێ ئەکرێت، جەهمیەکان زیادەڕۆیان کرد تا ئەوەی نەفیان کرد.

وە موشەبیهەکان زیادەڕۆیان کرد تا نمونەیان بۆ دانا.

جەهمیەکان تەوبەیان پێ ئەکرێت، موشەبیهەکانیش بەهەمان شێوە، تۆمەتباری کردن بە شتێکی زۆر گەورە.

**(شرح أصول اعقتاد أهل السنة لـ اللالكائي : ٩٣٤)**

١٢ - أحمد بن حنبل (٢٤١ هـ) ئەڵێ:

الله مەشوبهێنن بە درووستکراوەکانی ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ (الشورى : ١١) .

(الحجة في بيان المحجة ١/٤٣٦)

١٣ - لە حنبلـەوە کە پرسیار لە أحمد ئەکات دەربارەی وتەی موشەبیهە کە ئایا چی ئەڵێن؟

وتی: (هەرکەس بڵێت چاوی وەک چاوم وایە، وە دەستی وەک دەستم وایە، وە پێی وەک پێم وایە، ئەوە الله ی شوبهاندووە بە درووستکراوەکانی، وە سنوری بۆ دائەنێت، وە ئەمە قسەیەکی خراپە، وە ئەمە سنوردارکراوە، قسەکردن لەمەدا پێم خۆش نیە) .

(درء التعارض ٢/٣٢)

---

: (وە سنوری بۆ دائەنێت) واتە سنووربۆ سیفەتەکانی دائەنێت، واتە ئەیچوێنێت بە سیفەتی دروستکراوەکانی، لێرەدا مەبەستی ئەوسنوورە نییە کە هەرئیمام أحمد و سەلەف ئەڵێن الله تعالى لەسەرعەرشە وحدی هەیە، واتە جیایە لە دروستکراوەکانی .

## ١٤ - إسحاق بن راهويه (٢٣٨ هـ) ئەڵێ:

**هەرکەس وەصفی الله بکات وە صیفەتەکانی بشوبهێنێت بە صیفەتی هەر یەکێک لە درووستکراوەکانی الله ئەوە کافر بووە بە الله ی مەزن، لەبەرئەوەی خۆی وەصفی صیفەتەکانی کردووە، بەڵکو تەسلیم بوون بۆ فەرمانی الله وە بۆ ئەوەی رسول دایناوە.**

**(شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي : ٩٣٧)**

## ١٥ - محمد بن إسماعيل البخاري (٢٥٦ هـ) ئەڵێ:

الله تعالى ئەفەرمووێت : | فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا | **(البقرة : ٢٢)** بۆ الله هاوتا نیە، وە نمونەی نیە، وە هیچ شتێک لە صیفەتەکانی لە درووستکراوەکاندا نیە.

**(خلق أفعال العباد : ٤٧٩)**

## ١٦ - أحمد بن سنان القطان (٢٥٨ هـ) ئەڵێ:

**موشەبیهە ئەوانەن کە زیادەڕۆیان کرد و لایاندا لە فەرموودەکان، بەڵام ئەوانەی قسە بە فەرموودەکە ئەکەن و هیچ زیادەیەک ناخەنە سەر ئەوەی کە بیستوویانە ئەوانە ئەهلی سوننەن و دەستگرتوون بە ڕاستیەکەوە، وە ئەوانە موشەبیهە نین، تەشبیهیان نەکردووە، بەڵکو ئیمانیان هێناوە بەوەی فەرموودەکە هێناویەتی، ئەوانە ئیمانداران بەڕاستخەرەوەن بەوەی پێغەمبەر و کیتاب و سوننەت هێناویانە.**

(الحجة في بيان المحجة : ١/١٨٠)

١٧ - محمد بن سعيد المروزي ئەڵێ:

پرسیار کرا لە أبو زرعة الرازي (٢٦٤ هـ) دەربارەی وتەی عیسى عليه السلام بۆ الله: | تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ | (المائدة : ١١٦) .

وتی: ناوترێت نەفسی وەک نەفسی من وایە، لەبەرئەوەی کوفرە .

وە ئەفەرموێ : | لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ | (ص : ٧٥) الله عز وجل ئادەمی درووستکردووە بە دەستی خۆی، وە ناوترێت دەستی بەوێنەی دەستی من وایە یان وەک دەستی من وایە لەبەرئەوەی کوفرە، بەڵکو ئیمان ئەهێنین بە هەموو ئەوانە.

(التوحيد لابن منده : ٩٠٢)

١٨ - ابن قتيبة عبدالله بن مسلم (٢٧٦ هـ) ئەڵێ:

ناڵێین پەنجەی وەک پەنجەمان وایە، وە دەستی وەک دەستمان وایە، وە مشتی وەک مشتمان وایە، لەبەرئەوەی هەرشتێک لەوانەی ئەولە هیچ شتێکی ئێمە ناچێت.

(تأويل مختلف الحديث)

١٩ - عثمان بن سعيد الدارمي (٢٨٠ هـ) ئەڵێ:

بەڵام وتەکەت کە ئەڵێی چۆنیەتی بۆدانانی ئەم صیفەتانە و تەشبیهـ کردنیان لەوەی لە درووستکراوەکانیدا هەیە هەڵەیە، ئێمە ناڵێین هەڵەیە وەک ئەوەی تۆ وتت، **بەڵکو لای ئێمە کوفرە، وە ئێمە بۆ چۆنیەتی دانان و تەشبیهـ کردن بەوەی هەیە لە درووستکراوەکاندا لە ئێوە توندترین، جگە لەوەی ئێمە تەشبیهـ ناکەین و چۆنێتی بۆ دانانێین و بێباوەڕنابین پێی و بەدرۆی ناخەینەوە و بەطالی ناکەینەوە بە تەئویلێکی گومڕایانە)**.

وە دەربارەی ئەثەرەکەی ابن عباس رضي الله عنهما (هیچ نمونەیەک بۆ الله نیە) ئەڵێ :

(وە ئێمەش ئەوە ئەڵێین وەک چۆن ابن عباس وتوویەتی **هیچ نمونەیەک بۆ الله نیە، وە هاوشێوەی نیە، وە لە هیچ شتێک ناچێت، وە هیچ شتێک صیفەتێکی نیە وەک صیفەتەکانی ئەو، هیچ شتێک لە ئەو ناچێت**، ئەو شتە گەورەترین شتە، وە درووستکاری شتەکانە، وە باشترینی شتەکانە، نوری ئاسمانەکان و زەویە).

**(النقض على المريسي ص ٥٤ و ٥٧٨)**

٢٠ - ابن جرير الطبري (٣١٠ هـ) دەربارەی فەرمایشتی | **فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَۚ** | **(النحل : ٧٤)** .

ئەڵێ: نمونە دامەنێن بۆ اللە، وە هیچ مەچوێنن پێی، لەبەرئەوەی وێنەی نیە و هاوشێوەی نیە.

**(تفسير الطبري : ١٤٨/١٤)**

**٢١ - ابن منده (٣٩٥ هـ)** ئەڵێ:

بەهەمان شێوە وەک لەسەرەتادا دەربارەی ئەم هەواڵانە لە صیفەتەکان لەم کتێبەماندا وتمان ئەڵێین **بەڕێی ئەکەین بەبێ تەمثیل وبەبێ تەشبیه وبەبێ چۆنیەتی بۆدانان وبەبێ قیاس وبەبێ تەئویل، لەسەرئەوەی سەلەفی ڕاستگۆ بۆیان گواستووینەتەوە لە هاوەڵانی پاکەوە لە هەڵبژێردراوەوە ﷺ، وە بە جاهیلی دائەنێین هەرکەس قسە بکات بەبێ ڕوونکردنەوەیەک لە رسول یان هەواڵێک لە هاوەڵانی ئامادەبوو لە دابەزین، وە بەرین لەلای اللە لەوەی پێچەوانەی قورئان وکەلامی رسول ئەکات.**

**(التوحيد)**

**٢٢ - ابن أبي زمنين (٣٩٩ هـ)** ئەڵێ:

**ئەم صیفەتانەی پەروەردگارمان کە خۆی وەصفی خۆی پێکردووە لە کتێبەکەی، وە پێغەمبەرەکەی وەصفی پێکردووە، لە هیچ شتێکیاندا دیاریکردن وتەشبیه وئەندازەگیری نیە، پاکوبێگەردی بۆ ئەو کەسەی کە هیچ**

شتێک لەو ناچێت وە ئەو بیسەر و بینەرە، چاوەکان نەیانبینیوە کە چۆنە، بەڵکو دڵەکان لە حەقیقەتی ئیمان پێهێنانی بینیویانە.

(أصول السنة : ٧٤)

**٢٣** - ابن تيمية (٧٢٨ هـ) ئەڵێ:

**هەرکەس بڵێت عیلمی الله وەک عیلمی من وایە، یان قودرەتی وەک قودرەتی من وایە، یان کەلامەکەی وەک کەلامی من وایە، یان ویست و خۆشەویستی و ڕازیبوون و توڕەبوونەکەی وەک ویست و خۆشەویستی و ڕازیبوون و توڕەبوونی من وایە، یان بەرزبوونەوەکەی لەسەر عەرش وەک بەرزبوونەوەی من وایە، یان دابەزینەکەی وەک دابەزینی من وایە، یان هاتنەکەی وەک هاتنی من وایە، وە نمونەی ئەوانە، ئەوە اللە ی چواندووە و دایناوە بە نمونەی درووستکراوەکانی، پاک و بێگەردی بۆ الله لەوەی ئەیڵێن، وە ئەوە گومڕایەکی پیسە بەڵکو کافریشە.**

**وە هەرکەس بڵێت الله عیلمی نیە و قودرەتی نیە و کەلامی نیە و ویستی نیە و بیستنی نیە و بینینی نیە و خۆشەویستی نیە و ڕازیبوونی نیە و توڕەبوونی نیە و بەرزبوونەوەی نیە و هاتنی نیە و دابەزینی نیە ئەوا ناوە جوانەکانی الله و صیفەتە بەرزەکانی پەکخستووە، وە ئیلحادی کردووە لە ناوەکانی الله و ئایەتەکانی، وە ئەوە گومڕایەکی پیسە، بەڵکو کافریشە.**

مەزهەبی پێشەوایان و سەلەف جێگیرکردنی صیفەتەکانە، وە نەفیکردنی تەشبیهە بە درووستکراوەکان، جێگیرکردن بەبێ تەشبیه، وە پاکڕاگرتن بەبێ پەکخستن.

(مجموع الفتاوى : ٤٨٢/١١)

---

: ئەشعەریە جەهمیەکان بە بیانووی پاکڕاگرتنی الله لە تەشبیه دێن تەواوی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات تەحریف ئەکەن، چونکە لەڕاستیدا مانای ڕووکەش و حەقیقی ئایەتەکانی سیفات بە کوفرو تەشبیه ئەزانن، ئەگینا بۆ تەحریفی ئەکەن؟

٢٤ - علي بن المديني (٢٣٤ هـ) ئەڵێ:

هەرکەس وتی فلان کەس موشەبیهەیە بزانن ئەوە جەهمیە.

(اعتقاد أهل السنة اللالكائي)

٢٥ - إسحاق بن راهويه (٢٣٨ هـ) ئەڵێ :

نیشانەی جەهم و هاوەڵەکانی بانگەشەیانە لەسەر ئەهلی جەماعەت کە گوایە موشەبیهەن، بەڵکو خۆیان موعەطیلەن، ئەگەر درووست بێت پێیان بوترێت موشەبیهە ئەوە هەڵی ئەگرێت، وە ئەوان ئەڵێن پەروەردگار لە

هەموو شوێنێکە لە نزمترین زەوی و بەرزترین ئاسمانەکان هەر یەک واتایە، وە درۆیان کرد لەمەدا وە پابەندئەبن بە کوفرەوە.

(شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي)

---

: (ئەگەردرووست بێت پێیان بوترێت موشەبیهە ئەوە هەڵی ئەگرێت) و اتە جەهمیەکان خۆیان موشبیهەن، چونکە هاتن تەماشای قورئان و فەرموودەیان کرد و تەشبیهیان کرد بۆ سیفاتەکان لە مێشکی خۆیاندا ئینجا هاتن سیفاتەکانیان پەکخست .

**٢٦** - قتيبة بن سعيد (**٢٤٠** هـ) ئەڵێ:

ئەگەر پیاوێک پێی وتی موشەبیهە ئاگاداری بە، لەبەرئەوەی لەسەر ڕای جەهمە.

---

: ئەگەر تۆش کەسێکت بینی بەو کەسانە ئەڵێت موشەبیهە و موجەسیمە کە ئەو سیفەتانەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە ئەوە بزانە جەهمیەکی جەهەننەمی پەکخەرە .

(ذم الكلام : ١١٧٧)

**٢٧** - الإمام أحمد بن حنبل (**٢٤١** هـ) ئەڵێ:

بینیم ئەهلی ئەهواء و بیدەع و پێچەوانەکاران ناوانێکی ناشرین لە ئەهلی سوننە ئەنێن، ئەیانەوێت بەمە عەیبداریان بکەن، وە تانەیان لێ بدەن، وە

غەیبەتیان بکەن، وە سوکیان بکەن لای گەمژە و جاهیلەکان، ئەمما جەهمیەکان ئەوانە ناوی ئەهلی سوننە ئەنێن: المشبهة، وە درۆیان کرد جەهمیەکانی دوژمنی اللە، بەڵکو خۆیان ئەولاترن بە تەشبیه، سوپاس بۆ ئەو اللە یەی هیدایەتی داین بۆ ئەمە، وە ئێمە ناتوانین هیدایەتی خۆمان بدەین ئەگەر اللە هیدایەتمان نەدات، نێردراوانی پەروەردگارمان بە حەق ەوە هاتوون.

**(إبطال التأويلات : ٤٦/١)**

**٢٧** - أبو حاتم الرازي (**٢٧٧** هـ)ئەڵێ:

نیشانەی ئەهلی بیدەع، قسە وتنە بە ئەهلی ئەثەر، وە **نیشانەی جەهمیەکان ناونانی ئەهلی سوننەیە بە موشەبیهە**.

**(شرح أصول اعتقاد أهل السنة لـ اللالكائي)**

**٢٨** - أبو زرعة الرازي (**٢٦٤** هـ) ئەڵێ:

**هەرکەس وەصفکەرانی پەروەردگاریان بەوەی خۆی وەصفی خۆی پێکردووە لە کیتابەکەی، وە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی وە بەبێ تەشبیه و تەمثیل دایە پاڵ موشەبیهە، ئەوە پەکخەرە، نەفیکەرە، وە بەڵگە هێنانەوە لەسەرئەوان بە دانەپاڵیان بۆلای تەشبیه ئەوە ئەوانە پەکخەری نەفیکەرن،**

**بەهەمان شێوە ئەهلی عیلم و ایان ئەوت وەک عبدالله بن المبارك و وكيع بن جراح .**

**(الحجة في بيان المحجة : ١/١٨٧)**

---

**: هەمیشە ئەشعەریە جەهمیە ئیماندارەکان بە کوفری کەلام بەڕاستخەرەوەکانی قورئان و فەرمووەدەیان تۆمەتبارکردووە بە تەشبیه و تەجسیم .**

**٢٩** - حرب الكرماني (**٢٨٠** ه) ئەڵێ:

بینیم ئەهلی ئەهواء و بیدەع و پێچەوانیکاران ناوانێکی ناشرین لە ئەهلی سوننە ئەنێن، ئەیانەوێت بەمە عەیبداریان بکەن، وە تانەیان لێ بدەن، وە غەیبەتیان بکەن، وە سوکیان بکەن لای گەمژە و جاهیلەکان، ئەمما **جەهمیەکان ئەوانە ناوی ئەهلی سوننە ئەنێن: المشبهة.**

**( كتاب السنة : ١١٢)**

**٣٠** - ابن خزيمة (**٣١١** ه) ئەڵێ:

(هەرکەس ئەهلی ئەثەر کە بە کیتابی پەروەردگاریان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیان قسە ئەکەن تۆمەتبار بکات بە تەشبیه، ئەوە بەتاڵ و درۆ و

بوهتانی وتووە، وە پێچەوانەی کیتاب و سوننەتی کردووە، وە دەرچووە لە زمانی عەرەب).

وە ئەڵێ: (گوێبگرن ئەی خاوەن پێویستیەکان لەوەی ئەیلێین لەم بابەدا، وە باسی بوهتانی جەهمیەکان ئەکەین، وە درۆ و بوهاتنیان لەسەر زانایانی ئەهلی ئەثەر، وە تۆمەتبارکردنی باشترین درووستکراوان دوای پێغەمبەران لەوەی الله یان پاک ڕاگرتووە بە تەزویری جەهمیەکان لەسەر زانایانمان ئەوانە موشەبیهەن).

(كتاب التوحيد)

**٣١** - البربهاري (**٣٢٩** هـ) ئەڵێ:

**(ئەگەرگوێت لێبوو پیاوێک وتی فڵان کەس موبەشیهەیە وە فڵان کەس لە تەشبیها قسە ئەکات، بزانە ئەوە جەهمیە).**

(شرح السنة : ١٤١)

**٣٢** - ابن بطة (**٣٨٧** هـ) ئەڵێ:

(هەنێک لە موعتەزیەکان کاتێک ڕاستی ڕیوایەت و ئاثارەکانیان لا ڕوون بووەوە کە ناشتوانن گومانی تیا درووست بکەن و بیگۆڕن ئەوا ئەڵێن پێغەمبەر وای فەرمووە، بەڵام پێغەمبەر موشەبیهەیە، وە موشەبیهەش لای ئەوان کافر و مولحیدە).

(الإبانة الكبرى)

**٣٣** - إبن تيمية (**٧٢٨** هـ) ئەڵێ:

**(ئەوان** - واتە سەلەف - **کاتێک بیاندیایە پیاوێک ڕۆچووە لە نەفیکردنی تەشبیهـ بەبێ جێگیرکردنی صیفەتەکان ئەیانوت ئەوە جەهمیەکی پەکخەرە،** وە ئەمە لە قسەکانیاندا زۆر هەیە، جەهمی و موعتەزیلەکان تا ئەمڕۆ هەرکەس شتێک لە صیفەتەکان جێگیر بکات ناوی ئەنێن موشەبیهە بە درۆ و بوهتانێک لێیانەوە، وە بگرە موعتەزیلە پێشەوایانی وەک: مالك و هاوەڵانی، وە الثوري و هاوەڵانی، وە الأوزاعي و هاوەڵانی، وە الشافعي و هاوەڵانی، وە أحمد و هاوەڵانی، وە إسحاق بن راهويه، وە أبي عبيد و جگە لەوانیش ئەخەنە ڕیزی موشەبیهەکانەوە).

(مجموع الفتاوى : ٥/١١٠)

---

: جەهمیەکان سەردەمی إبن تيمية ئەشعەریەکانن، وە ئەو قسەیەی کە بە تۆخی دیاری کراوە سەد لە سەد جێبەجێ ئەبێت بەسەر ئەشعەریە جەهمیەکاندا .

### ٣٤ - ابن قیم (٧٥١ ه) ئەڵێ:

وە ئەمە پیشەی هەموو موبتەدیع و مولیحدێکە، وە ئەمە میراتە لە ناونانی کافرانی قورەیش لە رسول الله و هاوەڵانی بە (الصبأة) - الصبأة واتا کەسانێک شوێن گەمە و ڕابواردن کەوتوون یان لایانداوە لە دینێکەوە بۆ دینێکی تر والله أعلم - ، وە ئەم میراتیەیان لێوە هاتووە بۆ هەموو بەتاڵکەرەوە - بەتاڵکەرەوەی حەق - و مولحید و موبتەدیعێک ناوی ئەهلی حەق ئەنێن بە ناوانێکی ناشرین و خەڵک ڕاونەر.

وە کاتێک کەسێک کە صیفەتەکان جێگیر ئەکات پێیان وت ئەوە موشەبیهەیە، لە مێشکی خەڵکانێک وا وێنای ئەکەن و ئەڵێن الله نمونەی ئەوانە، وە ڕووی هەیە وەک ڕووی ئەوان، وە بیستنی هەیە وەک بیستنی ئەوان، وە دوو دەستی هەیە وەک دەستی ئەوان، وە دائەبەزێت وەک دابەزینی ئەوان.

وە کاتێک وتیان حەشەویە، لە مێشکی گوێگردا وا وێنای ئەکەن ئەو کەسە تەزویری کردووە لە دیندا کە لێی نەبووە، وە خستوویەتە ناوی، وە ئەوە تەزویرە و ئەصلی نیە.

**(الصواعق المرسلة : ٣/٩٥٠)**

## وتەی چەند کەسێکی کەم لەوانەی کە بە ڕاشکاوی ئەڵێن هەرکەس صیفەتەکان جێگیر بکات موشەبیهەو موجەسیمەیە :

١ - ثمامة بن أشرس یەکێک لە سەرە زلەکانی جەهمیەکان ئەڵێ: سیان لە پێغەمبەران موشەبیهەن :

موسی کاتێک وتی: | إِنْ هِيَ إِلَّا فِتْنَتُكَ | (الأعراف : ١٥٥)

وە عیسی کاتێک وتی: | تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَۚ | (المائدة : ١١٦)

وە محمد کاتێک وتی: (پەروەردگارمان دائەبەزێت) .

(مجموع الفتاوی : ٥/١١٠)

٢ - ابن حجر العسقلاني الجهمي لە شەرحەکەی بۆ صحیح البخاري [فتح الباري] وتەی زۆرێک لەو پەکخەری صیفەتانە نقلْ ئەکات کە ئەهلی سوننە ناوئەنێن بە موشەبیهە و موجەسیمە وە لەوانەش:

ابن بطال کە ئەڵێ: وە موجەسیمەکان وتیان مانای الاستواء واتە جێگیربوون).

٣ - القرطبي **الجهمي** ئەڵێ:

موجەسیمە ئەوانەن کە ئەوەی لە کیتاب و سوننەت ڕووکەشەکەی جیسمی تیایە کۆیان کردۆتەوە، بگرە بیروباوەڕیان وایە کە الله جیسمە، وە وێنەی هەیە، ڕووی هەیە، چاو و دەست و لا و پێ و پەنجەی هەیە .

**(المفهم : ٦/٦٧٠)**

---

**: ئەم جەهمیە سەلەف و ئەهلی سوننە تۆمەتبار ئەکات بە دانانی جسم بۆ الله تعالی، بەڵام سەلەف رحمهم الله هەموو ئەو سیفەتانەی لە قورئان و فەرمووده و ئاثارەکاندا هەیە جێگیریان کردووە بۆ الله لەسەر مانای حەقیقی و ڕووکەشی سیفەتەکە، وە هەرگیز باسی جسم یان نەکردووە، و اتە لەبارەی جسم ـەوە نە جێگیریان کردووە، نە نەفیان کردووە، بەڵکو هیچ قسەیەکیان تێدا نەکردووە چونکە بابەتێکی داهێنراوە .**

٤ - الشوكاني **الجهمي** دەربارەی صیفەتەکانی الله ئەڵێ:

لەم بەشەدا سێ مەزهەب هەن، یەکەمیان: هیچ ڕێگایەک نیە بۆ تەئویل کردن تێیدا بەڵکو لەسەر ڕووکەشەی بەڕێ ئەکرێت و هیچ شتێکی لێ تەئویل ناکرێت، وە ئەمە وتەی موشەبیهەکانە.

**(إرشاد الفحول : ٢/٢٣)**

---

: سەیری پۆستەکانی ئەم کەناڵە بکەن بۆناسینی ئەوانە وجگە ئەوانیش :

https://t.me/imamakany_kufr

جەهمی و ئەشعەریە جەهمیەکان بەوە نەوەستاون بگرە هەستاون بە دانانی کتێب کە تیایا صیفەتەکانی الله تعالی یان پەکخستووە وە ڕەددی ئەهلی سوننەیان پێداوەتەوە، کەمێک لەوانەش:

١ - التوحيد وكفر المشبهة ى بشر المريسي **الجهمي** ٢١٨ هـ

٢ - الرد على المشبهة ى محمد بن شجاع الثلجي **الجهمي** ٢٦٧ هـ

٣ - دفع شبه التشبيه بأكف التنزيه ى ابن الجوزي **الجهمي** ٥٩٨ هـ

٤ - مشكل الحديث ى ابن فورك **الجهمي** ٤١٠ هـ

٥ - الرد على المشبهة ى ابن عساكر **الجهمي** ٥٧١ هـ

٦ - تأويل الأحاديث الموهمة للتشبيه ى السيوطي **الجهمي** ٩١١ هـ

موعەطیلە خۆیان لە صیفەتەکان تێناگەن جگە لەسەر ئەو شێوەیەی کە شایستەیە بە درووستکراوەکان، سەرەتا ئەکەونە تەشبیهەوە دواتر ئەیانەوێت

ڕزگار ببن لەو تەشبیهە لێی ڕائەکەن و ئەڕۆن بۆ پەکخستنی، جارێکی تر ئەکەونە تەشبیهەوە بەوەی الله ئەشوبهێنن بە شتێکی کەموکورٍ وەک چۆن **البخاري** لە **(خلق أفعال العباد : ٣٥)** ئەڵێ:

(هەنێک لە ئەهلی عیلم ئەڵێن جەهمیەکان موشەبیهەن، لەبەرئەوەی پەروەردگاریان چواند بە لاڵ و کەڕ و کوێر وە بەوەی قسە ناکات، وە جەهمیەکان ئەڵێن قسە ناکات و هیچ نابینێت وە ئەڵێن ناوی الله مەخلوقە).

جەهمی و ئەشعەریەکان کەسێک کە صیفەتەکانی الله تعالى جێگیر بکات پێی ئەڵێن یەهودی موجەسیمە بۆ ئەوەی خەڵک لێی ڕابکەن و وەک تانەلێدانێکیش بەڵام سەریان دای لەبەرد ئەوان هێندەی یەهود کە خراپترین درووستکراوی الله ن پەوەردگاری خۆیان نەناسیوە، بەشێکی کەم لە وتەی ئەوانەی بە ئەهلی سوننە ئەڵێن یەهودی موجەسیمە:

١ - الخطابي **الجهمي** لە شەرحی حەدیثی پیاوە یەهودیەکە کاتێک دێتە لای رسول الله وە صیفەتی پەنجەکان بۆ الله جێگیر ئەکات تانە ئەدات لە فەرموودەکە بە کۆمەڵێک شت، لەوەش:

١ - ئەوە لە وتەی یەهودی موشەبیهەیە

**(أعلام السنن)**

٢ - ملا علي القاري **الجهمي** دەربارەی ئەو حەدیثە ئەڵێ:

ئەم فەرموودەیە ڕووکەشەکەی دابەشکردنی شتەکانە لەسەر پەنجەکان، بەردەستە بۆ ئەوەی ئەندام جێگیر بکرێت، وەک پێنج پەنجەکە کە ئەوەش مەزهەبی موجەسیمەی یەهودە، وە ئەهلی بیدەعیش.

**(مرقاة المفاتيح ١٨٢/١٠)**

**٣** - القرطبي **الجهمي** ئەڵێ:

زۆرینە لە یەهود ئەوەیە بیروباوەڕی موجەسیمەیان هەیە، وە الله کەسێک خاوەنی ئەندامە، وەک ئەوەی غولاتی حەشەویەکان لەم میللەتە بیروباوەڕیان وایە.

**(المفهم : ٢٩٣/٧)**

هۆکاری ئەوەی جەهمی و ئەشعەریەکان ئەهلی سوننە ناو ئەنێن بە یەهود ئەوەیە یەهود لێیانەوە گواستراوەتەوە جێگیرکردنی کۆمەڵێک صیفەتی الله تعالى وەک دەست و پەنجە و وێنە و هی تریش کە ئەمەش لای جەهمی و ئەشعەریەکان تەجسیمە، لەو صیفەتانەی کە یەهود جێگیریان کردووە:

**١** - صیفەتی دەست :

| **وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْۘ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُۚ** | **(المائدة : ٦٤)**، الله تعالى ئیقراری کردووە لەسەریان

بە جێگرکردنی صیفەتی دەست، وە نکۆڵی کردووە لەسەریان بە وەصف کردنیان بەوەی چروک و ڕەزیلە .

**ابن قیم** ئەڵێ : الله تعالى نکۆڵی کرد لەسەر یەهود بەوەی دەستی الله یان دایە پاڵ عەیب و کەموکوڕی، وە نکۆڵی نەکرد لەسەریان بە جێگیرکردنی دەست بۆ خۆی، الله ئەفەرموێ: | **وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُۚ** | (**المائدة : ٦٤**)، لەعنەتی لێکردن لەسەر ئەوەی وەصفی دەستیان کردووە بە عەیب جگە جێگیرکردنی دەستی، وە زیادەیەکی داناوە و جێگیری کردووە لەسەر ئەوەی وتیان بەوەی دەستەکانی کراوەن، وە بەمە شارەزای چەواشەکاری جەهمیە پەکخەرەکان ئەبیت کاتێک وتیان الله لەعنەتی کردووە لە یەهود لەسەرئەوەی دەستیان بۆ جێگیر کردووە وە ئەوان موشەبیهەن وە ئەوانە پێشەوایانی موشەبیهەکانن، وردبەرەوە لەم درۆ و چەواشەکاریەی کە کردوویانە - جەهمیەکان - ، وە ئایەتەکە بەڕاشکاوی پێچەوانەی ئەوانە.

**(مختصر الصواعق : ٣/٩٥٧)**

**٢ -** صیفەتی پەنجەکان :

لە عبدالله بن مسعود ـەوە رضي الله عنه ئەفەرموێ:

زانایەک لە زانایانی یەهود هاتە لای رسول الله ﷺ پێی وت: ئەی محمد؛ ئێمە بینیومانە - هەواڵەکە - کە الله ئاسمانەکان دائەنێت لەسەر پەنجەیەکی، وە زەویەکان لەسەر پەنجەیەکی، وە دارودرەخت لەسەر پەنجەیەکی، وە ئاو و خۆڵ لەسەر پەنجەیەکی، وە درووستکراوەکانی تریش لەسەر پەنجەیەکی، ئەفەرموێ: من پاشام.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێکەنی تا ددانەکانی پشتەوەی دەرکەوت وەک بەڕاستخستنەوەی بۆ وتەی زاناکە، دواتر رسول الله صلی الله علیه وسلم خوێندیەوە ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾ (الزمر : ٦٧)

**(رواه البخاري ٤٨١١ و ٧٤١٤، ومسلم ٧١٤٧)**

**والحمدلله رب العالمين**